# دەتەوێ لە گرفتی
# بێکاری
# ڕزگارت بێت؟



حەسەن مینە
ڕاهێنەر و ڕاوێژکاری کۆمپانیاو دامەزراوەکان



## نهێنی
## دەستکەوتنی کار فێربە

ناوی کتێب: دەتەوێت لە گرفتی بێکاری ڕزگارت بێت؟
نـــــاوی نووســـــــەر: حــەســەن مــیـنـە
دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی
نۆبــەتـی چــــــاپ: یــەکــــــەم ٢٠٢٢
تـیــــــــــــراژ: ١٠٠٠ دانــــــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (        ) ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە

# دەتەوێت لە گرفتی
# بێکاری
# ڕزگارت بێت ؟

نهێنی دەستکەوتنی کار فێربە

نووسینی

حەسەن مینە

ڕاهێنەر و ڕاوێژکاری کۆمپانیا و دامەزراوەکان

# ناوەڕۆك





# پێشەکی

ئەو چرکە ساتانەی بێکاریت و هەموو دەرگاکان بەڕووتدا داخراون، لە ماڵەوە دانیشتویت و بۆ کڕینی کراسێك داوا لە دایك و باوکت دەکەیت، ئاستی متمانە بەخۆبوونت بە جۆرێك دادەبەزێت، ئەگەر ئەوەندەی سوقرات بزانیت، هەستدەکەیت نەزانیت و کەسێك نیە لەم ئەستێرەیەدا کاری بەتۆ بێت، یان تۆ بۆ هیچ کارێك بشێیت. هەواڵێکی زۆر خۆشم پێیە، ئەوە تەنها وەهمە و لەبێکاریەوە دروست بووە.

هەرکاتێك خۆت دۆزیەوە لە بوارێکدا و کارامەیی و توانا و زانیاریەکانت ڕێکخست، بۆتدەرکەوت کە چ کائینێکی مەزنیت و کاتێکیش بەرهەمت دەبینیت، بە جۆرێك سەرسام و دڵخۆش دەبیت، هەموو ساتێکت لە ساتی پێشخۆی گەورەتردەبێت، ئەگەر بتوانیت کات بکڕیت، کاتی هەموو خەڵك بۆخۆت دەکڕیت، ئەو بەرهەمەی دێتە بوون، بەجۆرێك دەبێتە ووزەی ئومێد و ژیان، ئەگەر دنیای خەڵکی شەوەزەنگ بێت، دنیاکەی تۆ چراخانە.

ئەم پەرتوکەی بەردەستت لەگەڵ پەرتوکی دواتر (چۆن دەبیتە ئەستێرە؟) (خوا یار بێت لەچەند مانگی داهاتودا بڵاوی دەکەمەوە)، بەهەردووکیان دنیایێکی ئاڵتونیت بۆ دروست دەکەن، بە ئەنجام دانی بەشێك لە تەکنیکەکان، نەك کار، بەڵکو لە چەند ساڵی داهاتودا بیر لە پڕۆژەی خۆت دەکەیتەوە، خەونی



منیش ئەوەیە بێیتە ئەو قۆناغە، چونکە بەکارمەندی ناتوانیت داهاتوت پڕشنگدار بکەیت.

فەرموو با بەیەکەوە گەشتێکی خۆش بکەین تا کۆتایی ئەم پەرتوکە، بۆئەوەی بەرە بەرە نەخشەی پرشنگداریت بکێشیت.....



حســن مــینه

ڕاهینەر و ڕاوێژکاری کۆمپانیا و دامەزراوکان

# ئامادەیت کار وەربگریت؟




هەموو دەزگا و کۆمپانیاکان حەز دەکەن کارمەندێك وەربگرن شیاو و ئامادە بێت بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستەی هەیانە، نەك کات و ووزە و پارە تەرخان بکەن بۆ ئامادەکردنی کەسەکە، ئەمەش بیرکردنەوەیەکی لۆژیکیە.

هەندێك وا بیردەکەنەوە کاتێك کاریان وەرگرت ئینجا خۆیان ئامادە بکەن، نەك خۆیان ئامادە بکەن و بە دوای کاردا بگەڕێن.

کۆمپانیا و دامەزراوەکان کەسێکیان ناوێت لای ئەوان خۆی ئامادە بکات، کەسی ئامادەیان دەوێت لەبواری خۆیدا شارەزا و پڕ زانیاری و بەتوانا بێت .

هەندێك کەس بــاوەڕی وایــە کاتێك زانکــۆی تەواوکرد و بڕوانامەی وەرگرت، ئەو بڕوانامەیە هەموو شتێکە بۆ وەرگرتنی کار، بەڵام بابەتەکە لەوە قوڵترە و بڕوانامەی ئەکادیمی سەرەتای چیرۆکەکەیە، کۆمپانیاکان و دامەزراوەکان گرنگی بەوە دەدەن تۆ چیت پێیە بۆیان و چ شارەزایی و کارامەییەکت هەیە بۆ ئەوان گرنگە.

چەندەحەزدەکەی کارت دەستبکەوێت، کۆمپانیا و دامەزراوەکان زیاتر لە تۆ حەزدەکەن کەسێکیان دەستبکەوێت ڕاستگۆ و شارەزابێت و کارەکەیان بباتە پێشەوە، ڕەنگە بەلاتەوە سەیربێت، بەڵام ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە، گرفتی سەرەکی دامەزراوەکان ئەوەیە، نازانن چۆن ئەم کەسانەیان دەست بکەوێت!

**خۆشبەختانە لە سەردەمێکدا دەژین، ڕێگاکانی خۆئامادەکردن زۆرن، وەك:**

- خوێندنەوەی پەرتوك لەبواری خۆتدا.





- بینینی کۆرس و ڕاهێنان (بەماوەیەکی کەم کارامەیی و توانای زۆرت پێدەدات).

- گەڕان لە سۆشیال میدیا و یوتوبدا لەو بوارەی هەڵت بژاردووە، بۆ زانینی زانیاری نوێ و کۆتا پێشکەوتن کە جیهان پێی گەیشتووە و هەموو ئەوەی پەیوەندی بە بوارەکەتەوە هەیە، چونکە ئەمڕۆ ئەنتەرنێت سەرچاوەیەکی زۆر گەورەیە بۆ شارەزابوون لەبواری خۆت.

- کاری خۆبەخشی لەگەڵ ڕێکخراوێك یان دەزگایەکی سەربەخۆ و ڕابردوو پاك، کە دەبێتە ئەزمونێکی گەورە، لەبواری کرداریدا خاڵی بە هێز و لاوازت بۆ دەردەکەوێت و دواتر کاریان لەسەر دەکەیت، کاتێکیش داواکاری پێشکەشی کۆمپانیایەك دەکەیت، ئەگەر ئەزمونت هەبێت زۆر ئاسانتر وەردەگیرێیت .

یەکێ لە هاوڕێکانم لەلایەن چەندین قوتابخانەوە چاوپێکەوتنی لەگەڵ کرا، لەگەڵ ئەوەی **CV** بەهێزبوو، بەدڵیان بوو، بەڵام هیچ ئەزمونێکی نەبوو، بۆیە وەرنەگیرا. (ئەگەر تەنها ١ساڵ ئەزمونێکی خۆبەخشی هەبووایە، بەدڵنیاییی ئێستا کارمەند بوو).





## چیرۆکێکی خۆش لەسەر کاری خۆبەخشی:

هاوڕێیەکم لە ڕێکخراوێکی کۆمەڵگای مەدەنی کاری لەگەڵ دەکردین، هیچی لە IT و سۆشیال میدیا نەدەزانی، دوای ماندووبوونی زۆر، فێری پۆست کردن بوو، فێری دیزاین بوو، هتد.... دواتر بەهۆی ئەم کەمە ئەزمونە لە کۆمپانیاییێکی بچووك وەرگیرا و خەریکی کاری دیزاین بوو بە پارەیەکی کەم، دوای ماوەیەکی تر بەهۆی ئەم کارەیەوە ناسرا و بوو بە بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی نەخۆشخانەیەکی بەناوبانگی تایبەت لە هەولێر، ئەم ئەزمونەش کردیە بەرپرسی ڕاگەیاندن لە دەزگایەکی گەورەتر.




# دەرفەتەکان دروست دەکرێن یان خۆیان دێن؟

قسەیەك هەیە دەڵێت: لە کۆی ١٠٠٠ دەرفەت ٩٩٨ یان دروست دەکرێن و تەنها ٢ دانە خۆی دێت و لە دەرگات دەدات، ڕەنگە ئەو کاتەش لەماڵ نەبیت.

کاتێك حەزرەتی موسا لە دەستی فیرعەون ڕایکرد، شوێنی نەبوو بحەوێتەوە، کاری نەبوو، تەنانەت خواردن نەبوو بیخوات، دواتر هەموو ئەوانەی دەست کەوت و ژنیشی هێنا، زیاتر لەوەی چاوەڕێی دەکرد (ئەوکاتە پێغەمبەریش نەبوو) وەك لە قورئاندا هاتووە :

﴿ قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ ﴾ قصص ٢٦

واتە: (یەکێك لە کچەکان ووتی: بابە بۆ بەکرێی ناگریت؟ چونکە بەڕاستی چاکترین کەسێك کە تۆ بیگریت بەکرێ، ئەم پیاوە بەهێز و ئەمین و دەست پاکەیە).

١- ئەمین بوو soft skill

٢- بەهێز بوو hard skill

(دواترهەریەکە لەو کارامەییانەی سەرەوە ڕوون دەکەینەوە).

حەزرەتی موسا پێشتر خۆی ئامادە کردبوو، ئەمین و بەهێز بوو، توانی بەردی سەر بیرەکە لابدات، بەڵام بەهێزی ئەمڕۆ پێناسەیەکی تری هەیە، بەمانای شارەزایی و بوونی کارامەیی و لیهاتوویی لە بوارێکی دیاریکراودا دێت.

## چیرۆکێکی سەرنج ڕاکێش :

بەرپرسی کارگێڕی یەکێك لە پەیمانگاکان لەشاری هەولێر، کە کۆرسێکم بۆ کردنەوە لەسەر بابەتی دەزگا، ووتی: دەزانی من چۆن لەم پەیمانگایە وەرگیرام؟

ووتم: فەرموو بۆم باس بکە.

ووتی: ئەم پەیمانگایە لە هاوینی ٢٠٢١ کۆرسێکیان کردەوە و منیش بەژداریم کرد، لەکۆتایی کۆرسەکەدا کاتێك فۆڕمی هەڵسەنگاندن دابەشکرا، چەندین تێبینی و پێشنیازم نوسی بۆ بەرەو پێش چوونی پەیمانگاکە و هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کار لەم پەیمانگایە بکەم، پێشنیازەکانم دان بە سەرۆکی پەیمانگاکە،

دوایی سەرۆکی پەیمانگاکە تەلەفۆنی بۆ کردم و داوای لێکردم کاریان لەگەڵ بکەم.

ئەم برادەرەم زیاتر ووتی: نەك وەرگیرام، ئێستا بوومەتە بەرپرسی بەشی کارگێڕی و هەر کارمەندێك وەربگیرێت دەبێت بە فلتەری مندا تێپەڕێت.

ئەگەر ئەم کەسە بەژداری کۆرسەکەی نەکردبا و تێبینی نەنوسیبا، کەس دەچوو بەدوایدا لەماڵەوە داوای کاری لێبکات؟

## تێبینیەکی گرنگ:

ئەم پەرتوکە دەیەها تەکنیك و ستراتیژی دانسقەی تێدایە، بۆئەوەی کار دەست بخەیت، بەڵام ئەوانە تەنها هۆکارن، ئەوەی زۆر گرنگترە هۆکاری هۆکارەکانە، کە خودای مەزنە و نابێت بەهیچ جۆرێك لەبیری بکەیت، پاش ئەوەی تەواو پشتت پێبەست، ئینجا هۆکارەکان بەکاربهێنە، زۆر جاریش هۆکارەکان زۆر بەجوانی بەکاردەهێنیت، بەڵام کارت دەست ناکەوێت، چونکە خودا دەیەوێت لەوە زیاترت پێبدات و بتکاتە خاوەن بزنس و پڕۆژەی خۆت، وەك چۆن جاکما لەکۆی بیست و شتێك کارمەند تەنها ئەو وەرنەگیرا لە KFC، وەرەتکرایەوە کاتێك داوای دامەزراندنی کرد، بۆئەوەی ببێتە پۆلیس لە شارۆچکەکەی خۆیدا، بەڵام دواتر علی بابای دامەزراند، کە بەتریلیۆن دۆلار کڕین و فرۆشتنی تێدا دەکرێت.

# گرنگی فێربوونی کارامەیی




یەك لەو کارمەندانەی لە توێژینەوە مەیدانیەکەدا گفتوگۆم لەگەڵ کرد، کچێکە لە نەخۆشخانەیەکی تایبەت لە شاری هەولێر، لەبەشی سروشتی، پزیشکەکە تورکە، کچەکەش هاوکاریەتی.

ئەم کارمەندە ووتی: دەمێك بوو خۆم خەریکی فێرکردنی تورکی دەکرد، تەنها لەڕێگەی تەلەفیزۆنەوە و بە باشی فێری زمانی تورکی بووم، ئەم بەشەش پێویستی بە کەسێك بوو تورکی بزانێت، یەکێ لە کارمەندەکان پێشنیازی منی کرد و زۆر ئاسان وەرگیرام.

لەم چیرۆکەوە تێدەگەین، هەم فێربوونی کارامەیی و خۆ ئامادەکردن زۆر گرنگە (ناکرێت دەرفەت بێت ئینجا خەریکی خۆ ئامادەکرن بیت، دەبێت خۆت ئامادە بکەیت ئینجا کە دەرفەت هات بیقۆزیتەوە)، وەهەم بوونی پەیوەندی، کە دواتر ئاماژەی پێدەکەین.

گفتوگۆم لەگەڵ خاوەن عەقاراتێکی بەناوبانگ کرد لە ڕووی وەرگرتنی کارمەندەوە، ووتی: ٧٠٠ CVم لایە، چی لە کەسێک بکەم زمان نەزانێت و لەگفتوگۆدا باش نەبێت؟ ٨٠٠$ دەدەم بە کارمەند و ٢ ساڵ هەوڵی لەگەڵ دەدەم و پێی دەگەیەنم، ئەی نابێت لە بەرامبەردا قازانجم پێبگەیەنێت؟

ئەم خاوەنە زیاتر ووتی: دەمەوێت کەسێک وەربگرم لە گفتوگۆدا باش بێت، لە پەیوەندیدا باش بێت، زمان بزانێت، لە قەناعەت پێکردندا بەهێز بێت و دڵنیا بم سوودی دەبێت بۆم.

بۆیە ئەگەر تازە لە زانکۆ یان پەیمانگا دەرچوویت و ئەزموونت نیە، دەبێت بە کارامەیی و لێهاتوویی لە بوارێکدا خۆت بسەلمێنیت.

کارامەیی و خۆئامادەکردنت دەبێت بەپێی چەندین یاسای ئەڵماسی بێت، کە لە پەرتوکی (چۆن دەبیتە ئەستێرە؟) إن شاءالله لەم چەند مانگەی داهاتوودا بەشێوەی ئەلیکترۆنی بڵاوی دەکەمەوە و زۆر بەووردی تیشك دەخەمە سەر چۆن پسپۆڕی خۆت دیاری دەکەیت و لەچ بوارێکدا دەبیتە ئەستێرە و دەدرەوشێیتەوە؟ ئاماژە بەکۆمەڵێك تەکنیك دەکەم بەجێبەجێکردنیان دەرفەتی گەورەت

بۆ دەڕەخسێت(هەم ئەو پەرتوکەی بەردەستت، هەم پەرتوکەکەی تر، تەواوکەری یەکترن لەڕووی دۆزینەوەی بواری خۆت و ئەو تەکنیك و شاڕێگایانەی وادەکات کارامەیی و لێهاتوویەکانت بکەیتە سەرچاوەی داهات و دەرفەت و خزمەتی گەورەی پێبکەت).

ئەمەش نهێنی دانا و زانا و داهێنەرەکانە، کە بواری خۆیان دەدۆزنەوە و دواتر هەموو توانایان دەخەنە خزمەتی ئەو بوارە و دەردەکەون و کاری گەورە دەکەن، بەپێچەوانەی ئەوانەی تا کۆتایی تەمەنیان لە چەندان بواردا تواناکانیان دەخەنە گەڕ و ئەنجامێکی وایان نابێت، هەربۆیە داهێنەر و زانای گەورە لە وولاتانی پێشکەوتوو هەڵدەکەوێت، بەڵام لە وولاتانی دواکەوتوو، ئەو کەسانە هەڵناکەون.

یاخود ئەگەر دەرفەتت بۆ ڕەخسا، لە کۆرسی (دەتەوێت لە گرفتی بێکاری ڕزگارت بێت؟) بەژداریت کرد، باسی ئەو نهێنی و تەکنیککانە دەکەم و بە پراکتیکی بەژدار بووان فێر دەکەم، ئەگەر بەشێك لەم تەکنیکانە جێبەجێ بکەیت، من بەڵێنی نەك کار، بەڵکو داهاتوییێکی پرشنگدارت پێدەدەم، ئەو تەکینکانەی دەرفەتگەلی زۆریان بۆ من دروست کرد و بەردەوام دروست دەکەن، تەنانەت لەساتی نووسینی ئەم دێرانە ئەوەندە دەرفەتم بۆ هاتۆتە پێش، نازانم ڕوو لە کامیان بکەم).

پێش بەژداریت لەکۆرسی ناوبراو یان خوێندنەوەی پەرتوکی (چۆن دەبیتە ئەستێرە؟) بۆئەوەی کارت دەست بکەوێت، کۆمەڵێ

تەکنیکی زۆر گرنگ هەیە لەم پەرتوکەدا دەیخـەمەڕوو، کە ڕێگاکانی درەوشانەوەتە، دەبێت دەست بکەیت بە خۆئامادەکردن لە بوارێکی دیاریکراودا، ئەم بوارەش چۆن دیاریدەکەیت؟ (زۆر بەکورتی ) بەپێی ئەم ڕێسایە :

١- زۆرحەزت لێبێت.

٢- توانا و کارامەیت تێدا هەبێت.

٣- بوارێك بێت کارت لێی دەستبکەوێت و سەرچاوەی داهات بێت.

## گرنگی کارامەیی ناوازە :

ئەگەر کارامەیێکت هەبێت و گرنگ بێت و بەشی زۆری خەڵکی نەیزانن، زۆر باشترە لەوەی کارامەیێك بێت و بەشی زۆری خەڵکی بیزانن، هەم ئاسانتر وەردەگیرێیت، هەم موچەی باشتر وەردەگریت، ئەو کارامەییەی تۆ دەیزانی، ئەگەر خەڵکی بەشی زۆری بیزانن، هەم چانسی وەرگیرانت کەم دەبێت، هەم لە ئەگەری وەرگیراندا موچەت دیاری کراوە.



نەك لە مرۆڤدا، بەڵکو لە ئاژەڵانیشدا کارامەیی ناوازە زۆر گرنگە، ئەگەر سـەگێك کارامـەیی بـۆنکـردنی مادده سـڕکەرەکان و تەقەمـەنی

هەبێت، ئەگەر (بۆ نمونە) مووچەی خـاوەنەکەی ١٠٠٠$ بێت، ئەوا کرێی سەگەکەی ٣٠٠٠$ یان زیاتریش دەبێت، ئەگەر سەگێک کارامەیی ڕاوی نەبێت و دەمی لە نێچیردا، نێچیرەکە ناخورێت و حەرامە، بەڵام ئەگەر سەگەکە ڕاهێنرابێت بۆ گرتنی نێچیر، کاتێک نێچیر دەگرێت زۆر ئاساییە و گۆشتی نێچیرەکە دەخورێت.




بەرواری ٢٠٢٢/١/١٣ کەناڵە جیهانیەکان بە گرنگیەوە باسی مردنی (ماگاوایان)کرد، ماگاوا جرجێکی تەمەن ٨ ساڵان بوو، لەماوەی ٥ ساڵدا یارمەتی حکومەتی کەمبۆدیایدا لە پاکردنەوەی ١٤١هەزار مەتری چوارگۆشـە لە مـین و تەقەمـەنی، ماگاوا کارامەیی دۆزینەوەی تەقەمەنی ئەوەندە بەهێزبوو، تەنها لە ماوەی ٤٠ خولەکدا زەوییێکی تەواوی دەپشکنی، هەربۆیە ساڵی ٢٠٢٠ خەڵاتی ئاڵتونی پێبەخشرا و بە مردنیشی لە لایەن ڕێکخراوێکی گەورەی کەمبۆدیاوە پرسە و ماتەمینی بۆ ڕاگەیەنرا.

**فێربوونی کارامەیی وادەکات یەکێك داهاتی زیاتر بێت لە یەکێکی تر، کۆمپانیا و دامەزراوەکان بۆچی ئامادەن پارەی زیاتر بدەن بەکەسێك و نەیدەن بە کەسێکی تر؟ بەدڵنیاییەوە بوونی کارامەییە لە یەکێکیاندا و لە ئەوەی تردا نیە. دڵنیات دەکەمەوە، فێربوونی کارامەیی دەبێت بەپێی ئەو ڕێسایەی سەرەوە بێت، ئەگەرنا هەر کارێك بێت، هەر ماوەیەك حەزدەکەیت بیکەت.**

# کۆمپانیاکان شەیدای کام کارمەندانەن؟



بۆچونێکی زۆر هەڵە هەیە لە ناو ئەوانەی بەدوای کاردا دەگەڕێن، کە تەنها گرنگی دەدەن بە کارامەییە ڕەقەکان (**hard skill**) وەك: فـێربوونی کۆمـپیتەر، زمـانەکان و هتد....، وە فەرامۆشکردنی کارامەییە نەرمەکان (**soft skill**) وەك: توانای مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی تر، یارمەتیدان، کارکردن بە گروپ، پەرۆشی و دڵسۆزی، هتد......

کۆمپانیا و دامەزراوە زەبەلاحەکان لەسەر ئاستی دنیا زۆر زیاتر گرنگی بە کارامەیی نەرم دەدەن بەراورد بە کارامەیی ڕەق، چونکە فێربوونی کارامەیی ڕەق ئاسانە، بەڵام کارامەیی نەرم

قوڕسە و کەسەکە دەبێت خۆی پێبگەیەنێت یان لە پەروەردە و بونیادیدا هەبێت.

کۆمپانیاکان نایانەوێت کەسێك دابمەزرێنن بەس لەبەر ئەوەی کارامەیی ڕەقی هەیە، بەڵام کاتێك کارێکی تری لەو باشتری دەست کەوت، سوك و ئاسان بەجێیانبێڵێت، یاخود هەندێك نهێنی هەیە بیدرکێنێت بۆ دامەزراوەیەکی تر، یان کەسێک بێت گرفت دروست بکات و نەتوانێت لەگەڵ خەڵک و کارمەندانی تردا هەڵبکات، هتد.......

هەموو جارێک کە دەچووم کارتە زیرەکەکەم پڕبکەمەوە لە ئۆفیسی یەکێک لە کۆمپانیاکانی کارتی زیرەک (ماستەر کارت) لە شاری هەولێر، کارمەندێک هەبوو، زۆر ڕەزای قوڕس بوو، کە پرسیاری لێدەکرا، بەزاحمەت وەڵامی دەدایەوە، لە گفتوگۆدا زۆر خراپ بوو، دوای ماوەیەک سەیرم کرد نایبینم، پرسیارم کرد لە کارمەندێک بۆ ناو براو دیار نیە؟ ووتی: مامەڵەی زۆر خراپ بوو، ڕێزی خەڵکی نەدەگرت، بەدەم کەسەوە نەدەچوو، هتد..... کۆمپانیا پێی زانی و دەریکرد.

لە کاتی چاوپێکەوتن و هەڵسەنگاندندا، ئەو خاڵەی دامەزراوەکان زۆر حسابی بۆ دەکەن ئەوەیە، کەسەکە جگە لە کارامەیی ڕەق، چەندە کارامەیی نەرمی هەیە؟ وەچەند بە پەرۆشە بۆ دەزگاکە؟ ئایا بەشێك دەبێت لە بەرەو پێشبردنی کار و دەزگاکە یان دەبێتە خەم و سەرئێشە بۆ دامەزراوەکە؟

یـەك لە هۆكارە بەهێزەكانیش كاتێك كارمەندێك بە هۆی كەسێكی ناسیاوەوە وەردەگیرێت، جۆرێك گرەنتی تێدایە كە ئەم كەسە باش و ڕێكوپێك و بێگرفتە (كارامەیی نەرم).

گرنگیدان بە كارامەییە نەرمەكان لە ڕێگەی پەرتوك، خول، هتد..... چـەندین ڕێگەی ترەوە دەبێت، ئەگەر كارمـەندەكە وەریشگیرا بەهۆی ئەو كارامەییە نەرمانەوە پۆستەكەی بەرز دەكرێتـەوە، موچـەی زیـاد دەكرێت، لێپرسـراویەتی زیاتر وەردەگرێت، هتد....

هەندێك كۆمپانیای جیهانی زیاتر لە ٩ مانگ كات تەرخان دەكەن بۆ دۆزینەوەی ئەو كارمەندانەی كارامەیی نەرمیان لە ئاستی بەرزدایە، چونكە دەبنە موڵكی كۆمپانیا و دامەزراوەكە.

# سی ڤی (CV)



CV وەك كەتەلۆك وایە، ئەگەر كۆمپیتەرێك بكڕی و كەتەلۆكی لەگەڵ نەبێت، كەسیش وەصفی نەكردبێت، تەنها بە تەماشاكردنی، نازانیت تایبەتمەندیەكانی چین و چ جیاوازیەكی هەیە لەگەڵ كۆمپیتەرەكانی تر، كەتەلۆك وەڵامی هەموو پرسیارەكانت دەداتەوە، CVیش وایە، بەرامبەر بەهۆیەوە دەتناسێت.





ڕێگایەکمان نیە بڵێین ئەوە باشترینە بۆ نوسینیCV، بەڵام نابێت CV درێژ بێت، چونکە بەرامبەر ناتوانێت بیخوێنێتەوە، دەبێت کورت و پوخت بێت، تەرکیز بخرێتە سەر خاڵی بەهێز و توانا و کارامەییەکان.

دەبێتCV بە شێوازی ئەکادیمی پڕ بکرێتەوە، بوونی ئەزموون لە نوسینیدا و دانانی وشەکان لە شوێنی خۆی زۆر پڕبایەخە.

## CV دەبێت ئەم زانیاریانەی تێدابێت :

١- زانیـــاری کەسی وەك (ناو، بەرواری لەدایکبوون، بـــاری کۆمەڵایەتی، ناونیشان، بڕوانامە).

٢- ئەوکارامەیی و ئەزموونانەی هەتە یان دەستتخستووە.

٣- مێژووی پیشــەییت، فــەترەی کار، شــوێنی کار، ســروشتی کارەکەت (ئەگەر هەتبێت).

٤- نوسینی خول و کۆرسی زانستی و پرۆگرامی ڕاهێنان(ئەگەر هەتبێت).

## مەرجی CV باش چیە؟

١- کورت و پوخت بێت.

٢- ئاسان بخوێنرێتەوە.

٣- زانیاریەکان ڕوون بن.

٤- ڕاستگۆیيانە نوسرابێت و زیادەڕەوی تێدا نەبێت. (کەسێك لە CVیەکەی نوسی بووی، ئینگلیزی و عربی باش دەزانم، دواتر تاقی کرایەوە و دەرنەچوو).

٥- هەموو ئەو بەرهەم و ئینجازانەی لە ماوەی ڕابردوودا لەکاردا دەستتخستووە بینوسە.

٦- CVیەکەت دەبێت بەشێوەی بەرجەستە (وەرەقە) و ئەلیکترۆنی بێت، هەندێك دامــەزراوە بەشێوەی بەرجەســتە و هەندێکی تر بەشێوەی ئەلیکترۆنیان دەوێت.

٧- لە CVیەکەتدا بنوسە بۆ زانیاری زیاتر، دەتوانن سەیری سۆشیال میدیاکەم بکەن (لینکەکەی دابنێ)، ئەگەر سەیری بکەن زۆر باش دەبێت، بەمەرجێك سۆشیال میدیاکەت لەو بوارەی حەزدەکەیت کاری تێدا بکەیت دەوڵەمەند بێت (ئەگەر سەیریشی نەکەن، دڵنیایی دەدەیت بە بەرامبەر کە بە توانایت).

٨- نابێت یەکجۆر CVیت هەبێت و بۆ هــەموو کۆمــپانیا و دامەزراوەکان وەك یەك بێت، ئەگەر بە پێی پێویستی کۆمپانیا و دامەزراوەکە کە داوای چ جۆرە کارامەییەك دەکات، CV یەکەت ڕێکبخەیت زۆر سەرنجڕاکێش دەبێت .

٩- هەرچەند CVیەکەت بەهێزبێت، ئەگەر ئەزمون و کارامەییەکانت بەپێی پێویستی دامەزراوەکە و خواستی ئەوان نەبێت کاریگەری نابێت.

# شاڕێگەی دەستکەوتنی کار



## ١- بوونی سۆشیال میدیاییێکی بەهێز :

سۆشیال میدیا ناسنامەی تۆیە، دەکرێت ببێتە هۆکارێکی زۆر بەهێز نەك بۆ دۆزینەوەی کار، بەڵکو بۆ دەستخستنی دەرفەتی گەورە، بەڵام زیرەکی لە چۆنیەتی بەکارهێنانیدا گرنگە، ( زۆرێك لەوانەی بە دوای کاردا دەگەڕێن نازانن چۆن سۆشیال میدیاکەیان بەکاربهێنن، بەڵکو دژی خۆیان بەکاریدەهێنن).



ئەم سەردەمە، سەردەمی شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆژیایە، جیهان بۆتە گوندێکی بچووکی شووشەیی، چەندە مرۆڤ ئەم هێزەی زیاتر بە دەستەوە بێت، ئەوەندە زیاتر دەرفەتەکان بەڕوویدا دەکرێنەوە، بە پێچەوانەشەوە بە کارنەهێنانی بە شێوەی دروست مرۆڤ دەخاتە پەراوێزەوە.



## چۆن سۆشیال میدیاکەت بە دروستی بەکاردەهێنیت؟

بڵاوکردنەوەی هەمووشتێك لە سۆشیال میدیا، هەڵەیەکی گەورەیە، ئەو کەسەی دەیەوێت کاری دەست بکەوێت، دەبێت تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بکاتە سەکۆیەك بۆ پیشاندانی هێز و توانای لەو بوارەی حەزدەکات کار دەستبخات .

دەبێت بە هۆی سۆشیال میدیاوە خۆت نمایش بکەیت کە لە چ بوارێکدا بە هێزیت، کارامەیی و تواناکانت پێشان بدەیت، بۆ وێنە دەرچووی بەشی ژمێریاری، لەو بوارە بەهێزیت و هیچ کارێکت دەست ناکەوێت، لە چەندین کۆمپانیا و دامەزراوە ڕەتکراویەوە و کارت پێنادەن، زۆر ئاسان دەتوانیت ئەم هاوکێشەیە پێچەوانە بکەیتەوە و وا لە کۆمپانیا و دامەزراوەکان بکەیت خۆیان لە دەرگات بدەن و بە فانۆس (جۆرە چرایەکە) بە دواتدا بگەڕێن، چۆن؟

لە بواری خۆتدا بە نموونە کە ژمێریاریە بابەت بڵاوبکەیتەوە، ئەو زانیاریە نوێیانە بڵاوبکەیەوە کە لەسەر ئاستی جیهاندا گرنگیان پێدەدرێت، باسی ئەو بەرنامانە بکەیت کە بۆ سیستەمی

ژمێریاری کۆمپانیا و دامەزراوەکان گرنگن و چۆن کۆمپانیاکان لێیان سوددمەند دەبن، باسی ئەو کێشە و گرفتانە بکەیت کە لە سیستەمە کۆنەکانی بەرنامەکاندا هەیە و دەبنە گرفتی گەورە بۆ کۆمپانیاکان و لە چەندین دەستکەوتی گەورەی سەردەم بێبەش دەبن و دوای دەخەن، هتد.....

تەنها لە ماڵی خۆتەوە لەو بوارەی حەزدەکەیت کاری تێدا بکەیت، دەتوانیت بە جۆرێك خۆت نمایش بکەیت، دامەزراوەکان



سەرسام بکەیت بە خۆت، ئەگەر ماڵت لە لادێ بێت و لەسەر سنوور بژیت، دەرفەتی وات بۆدێتە پێشەوە، زۆر بە ئاسانی کاری باش و گەورە وەردەگریت لە سەنتەری شارەکان (خۆم وەك ڕاهێنەر چەندین دەرفەتی زۆر باشم لەبواری خۆمدا بە هۆی خۆنمایش کردنەوە هاتۆتە پێش، تەنانەت فراوانبوونی کارەکانم بەشی هەرە زۆری بە هۆی خۆنمایش کردنەوەیە کە کارکردنە لە

بواری کۆمپانیا و دام و دەزگادا، جاری واهەبووە پۆستێکم کردووە لە لینکید ئین ٢٤ کاتژمێر تێنەپەڕیوە، ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی پەیوەندیان کردووە بۆئەوەی کۆرسیان بۆ بکەمەوە، عەقارات هەیە خاوەن چەند لقە لە شاری هەولێر، پەیوەندیان کردووە پۆستی بەڕێوبەری گشتی وەربگرم، ئێستا لە ساتی نوسینی ئەم دێڕانە دەزگایەکمان (LEAD) داناوە لەگەڵ کۆمەڵێ کەسی پسپۆڕ و زۆر بە توانا کە کار لەسەر کۆمپانیا و دامەزراوەکان دەکەین، وەکار لە سەر ئەوە دەکەین، چۆن بزنسی خۆت دادەمەزرێنیت، یەك لە دامەزرێنەرانی دەزگاکە یاریدەدەری پرۆفیسۆرێکە لە ئەمەریکا و کوردە، بەهۆی سۆشیال میدیاوە یەکتریمان ناسی و ئەم فکرە جوانە هاتە بەرهەم، تۆش دەتوانی سنوورەکان تێپەڕێنیت، بەڵام دەبێت کاری لەسەر بکەیت).

بە پێی توێژینەوەی خۆم زۆرێك لەوانەی بەتوانا و لێهاتوون و کاریان دەست ناکەوێت، ناسراو نین و نەیانتوانیوە کەڵك لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان وەربگرن، بۆ وێنە کەسێك توێژەری کۆمەڵایەتیە و لەبری ئەوەی سۆشیال میدیا بۆ خزمەتی خۆی و خەڵك بە کاربهێنێت، جۆرەها پۆستی جیاواز بڵاو دەکاتەوە، تەندروستی، سیاسی، ئابووری، هتد.... کەس نایناسێت و هیچ کۆمپانیایەك باوەڕی پێناکات کاری پێبدات، چونکە متمانەی دروست نەکردووە و سۆشیال میدیاکەی دژی خۆی بەکارهێناوە کە لەبوارێکدا بناسرێت.

لەکاتی پێشکەشکردنی CV و چاوپێکەوتندا، سۆشیال میدیاکەت هۆکارێکی زۆر بەهێز دەبێت بەرامبەر بتناسێت و باوەڕت پێبکات، کاتێك سەیر دەکات، سۆشیال میدیاکەت پڕە لە زانیاری و بابەت و ڤیدیۆی تایبەت بەبوارەکەت و پڕ توانای، مژدەت دەدەمێ هیچ کۆمپانیا و دامەزراوەیەك حەز ناکات کەسێکی ئاوا لە دەست بدات .

**بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە :**

لە ساڵی ٢٠٢٠ لە مانگی ٤ و ٥دا کە سەردەمی کۆڕۆنا بوو، لە ئاستی دونیا و لە کوردستانیش بەشی زۆری شوێنەکان داخرابوون، مەترسی کۆڕۆنا لە لوتکەدا بوو، هاوڕێیەك تەنها لە ماوەی ٢-٣ کاتژمێردا، کاری دەستکەوت لە شەقامی شۆڕشی شاری هەولێر، دوای ئەوەی چوو بۆ چەند کۆمپانیایەك و لە یەکێ لە کۆمپانیاکان، کاتێك بەڕێوبەر سەیری سۆشیال میدیاکەی کرد و بینی ئەو کەسە زۆر چالاکە و زۆر شت دەزانێت لەو بوارەی کە کۆمپانیا کاری پێیە، هەر زۆر ئاسان وەرگیرا، ئەوەی زۆر سەیر بوو، ئەم کۆمپانیایە هیچ شوێنێکی بە تاڵی نەبوو، بازاڕ زۆر خراپ بوو، کۆمپانیاکە بۆئەوەی کەسێکی ئەوای لە دەست نەچێت ئامادەبوون بەهەر نرخێك بێت وەریبگرن.

## دەبێت چ جۆرە سۆشیال میدیایەك بەكاربهێنیت؟

**ئایا چ جۆرە سۆشیال میدیایەك بۆتۆ گونجاوە؟ فەیس بووك، ئینستگرام، سناپ چات، لینكیدئین، هتد....**



كاری بەڕێزت ئەو سۆشیال میدیایە دیاریدەكات كە هەڵی دەبژێریت، نەك هەموو جۆرە میدیایەك، بۆ وێنە دەتەوێت لەبواری كارگێڕی كۆمپانیاكان كار بكەیت، دەبێت سۆشیال میدیاكەت (فەیس بووك، لینكید ئین یان یوتوب بێت)، چونكە كۆمپانیا و دامەزراوەكان زیاتر ئەو سۆشیال میدیایانە بەكاردەهێنن و لەوێ چالاكن، ئەگەر بەڕێزت ئافرەتێكی دەست ڕەنگینی لە

دروست کردنی خواردندا، زیاتر پێویستە خۆت نمایش بکەیت لە ئینیستگرام و سناپ چات و فەیس بووکدا، چونکە کارگە و شوێنەکانی دروست کردنی خواردن، لەو سۆشیال میدیایانە چالاکن، یان ئەندازیارێکی میکانیکیت و کارت دەست ناکەوێت، دەبێت بزانیت ئەو کۆمپانیا و دامەزراوانەی کاریان بەتۆیە، کام سۆشیال میدیایە بە کاردەهێنن، دەبێت تۆش ئەوسۆشیال میدیایانەت هەبێت و خۆتیان تێدا نمایش بکەیت.

شارەزایی لەبوارێکدا و خۆنمایش کردن بە شێوازێکی جوان، وا دەکات سەرنجی ئەو کەسانە ڕابکێشیت کە لە بوارەکەی خۆتەوە نزیکن، دەبێت(جگە لە برادەر و دۆستە نزیکەکان)، ئەو کەسانەی پەیوەندیان بە بوارەکەتەوە هەیە ببنە هاوڕێت لەسۆشیال میدیاکەت، کاتێك **add** دەنێریت دەبێت بزانیت بۆ کێیە و چەند گرنگە بۆ تۆ، زۆر جار هەلەکان لەو کەسانەوە دێن کەهاوڕێتن لە سۆشیال میدیا و پەیوەندیان بە بوارەکەتەوە هەیە، نەك سۆشیال میدیاکەت پڕ بێت لە خەڵکی جیاواز و نەناسراو وهیچ پەیوەندیەکیان بە بوارەکەتەوە نەبێت.

## ٢-دۆزینەوەی درز

بەهۆی زۆری کارکردن و ڕۆتینی ڕۆژانە، نەخاوەن و نەبەڕێوبەر و نەدەستەی کارگێڕی کۆمپانیا و دامەزراوەکان ئەو کەموکورتی و درزانە نابینن کە هەیانە و زیانیان پێدەگەیەنن، بەڵام کاتێك تۆ دێیت و درزەکە پێشانی کۆمپانیاکە دەدەیت، بۆنموونە تۆ شارەزای بواری IT و ئەو دامەزراوەیەش چەندان درز و کەموکورتی هەیە لە سۆشیال میدیا و وێب سایتیاندا و نایبینن، پێشاندانی ئەم درزە، کە چ کاریگەریەکی خراپی کردۆتە سەر کۆمپانیا و دەزگاکە و لەو بوارەدا پاشی خستووە، زۆر کاریگەری دادەنێت کە دامەزراوەکە باش گوێت لێبگرێت.



دوای پیشاندانی درز، ئینجا چارەسەری خۆت زۆر بە ووردی و دەقیقی و حەکیمانە پێشکەش دەکەیت، کە دەتوانیت چ بۆ ئەو دامەزراوەیە بکەیت و پێشی بخەیت.

ئەوانەی لەهونەری ڕازیکردندا بەهێزن (لە کۆرسی هونەری ڕازیکردندا زۆرتیشکی دەخەمە سەر) کاتێك تیشك دەخەنە سەر درز و چارەسەرەکان پێشان دەدەن، توانایان زۆر بەهێزە لە دروستکردنی وێنەی زیهنی لە مێشکی بەرامبەردا، بەواتای بەباسکردنی چارەسەری ئەو درزەی بۆ وێنە لە سۆشیال میدیادا هەیە و ئەو چارەسەرەی تۆ پێتە، دەبێتە هۆی ناساندنی کۆمپانیاکە و دەرکردنی ناوبانگ و ڕێژەیەکی زۆر زیاتر خەڵك، ئاگاداری بەرهەم و خزمەتگوزاری کۆمپانیایەکە دەبێت.

دروست کردنی ئەو وێنەیەی لە مێشکی بەرامبەردا کە بە هاتنی تۆ بۆ کۆمپانیاکە چی ڕوو دەدات، زۆر جیاوازە لە وەی تەنها چەند قسەیەکی ئاسایی بکەیت.

کاتێك سەرۆکی میسر خەونی بەحەوت مانگا و حەوت گوڵە گەنمەوە بینی، حەزرەتی یوسف درزەکەی پێشاندا، کە ڕوو لە دەسەڵات و وولاتەکەی دەکات و دوای ٧ساڵ خۆشی، ئینجا ٧ ساڵ قات و قڕی ڕوو لە میسر دەکات. سەرۆکی میسر توشی سەرسوڕمان بوو، کاتێکیش حەزرەتی یوسف داوای لێکرد ئەو بەرپرسیاریەتە بداتە ئەو، بۆئەوەی چارەسەری بکات، سەرۆکی میسر یەکسەر ڕازیبوو، حەزرەتی یوسف نەك وەك کارمەند وەرگیرا، بگرە بوو بەکەسی دووەم و بڕیار بەدەست،

لە کونجی زیندانەوە بۆ لوتکەی دەسەڵات، تەنانەت ئەوانەشی لەگەڵیدابوون لە زیندان، هەموویان بوونە کاربەدەستی گەورە.

ئەگەر حـــەزرەتی یوسف درزەکەی پێشـــان نەدابایە و چارەسەری نەدابایە، دەیتوانی ئەو پۆستە گەورەیە وەربگرێت؟ بێگومان نەخێر.

قوتابییێکی زانکۆ باسی (سیستەمی لاینێکسی) بۆ دەکردم، سیستەمێکە هاککەرەکان بەکاری دەهێنن و بەهیچ کەس هاك ناکرێت، بەپێچەوانەی سیستەمی ویندۆزەوە کە بە ئاسانی هاك دەکرێت، ئەو قوتابییە ووتی: زۆرێك لە کۆمپانیا گەورەکان لەبەر سەلامەتیان ئەوسیستەمە بەکاردەهێنن.

هەرچەندە من زانیاریم نیە، بەڵام ئەگەر ئەم زانیاریە ڕاست بێت، قوتابییەکە ئەگەر لە سۆشیال میدیاکەی خۆی زانیاری بڵاو بکاتەوە لەو بارەیەوە و تواناکانی پێشان بدات، وەك لە خاڵی ١ لە سەرەوە باسمان کرد، یان داوا پێشکەشی کۆمپانیاکان بکات و گرەنتی پاراستنی سیستەمیان بکات، کە هاك ناکرێن و درزیان پێشان بدات کە لە ویندۆزدا هەیە و چارەسەریشیان پێشانبدات، چەند کۆمپانیا ئامادەن کاری پێبدەن؟ بێگومان زۆر.

## ٣- بوونی پەیوەندی زۆر :

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی دامەزراوەی لینکید ئین زیاتر لە ٪٥٠ی ئەوانەی کاریان دۆزیوەتەوە لە ڕێگەی پەیوەندیەوە بووە، کاتێك کۆمپانیایەك پێویستی بەکارمەندە، کارمەندانی دامەزراوەکە پێشنیازی ئەو کەسانە دەکەن کە دەیانناسن و هاوڕێیانن.

چەند پەیوەندیەکانت فراوان بکەیت، بەتایبەت لەو بوارەی کەتێیدا کارامەی، ئەوەندە هەلی دەستکەوتنی کارت زیاتر دەبێت.

پەیوەندی جیاوازە لە (واسطة)، کە دروست نیە و خورانی مافی کەسێکی ترە کە شایانی ئەوکارەیە،



(واسطة) بە مانای کەسێك بەهۆی کەسێکی ترەوە کارێك وەربگرێت کە توانای ئەنجامدانی نیە.

(واسطة) وەرگرتنی کارێکە، کەسەکە شیاوی کارەکە نیە، بەڵکو بەهۆی پەیوەندی شخصیەوە دەدرێت پێی و چەندین کەسی تری بەتوانا، لێی بێبەش دەبن، ئەوەش حەرامە و ترسناکە و خوای مەزن پێی ناخۆشە، لە هەر وڵاتێکدا بوو بەدیاردە، وڵاتەکە وێران دەبێت.

وەرگرتنی کارێك بەهۆی پەیوەندی شخصی کە شیاویت بۆ کارەکە و مافی کەس ناخۆرێت و دەبیە بەشێك بۆ بەرە و پێش بردنی کۆمپانیاکە، ئەوە زۆر دروستە و مافی خۆتە.

خەیاڵ بکە، دەزگایەك بەسەدان CV لەبەر دەستە و CV تۆش یەکێکە، ئەگەر پەیوەندییێکی باشت لەگەڵ هەندێك کارمەند هەبێت و پێشنیازی تۆ بکەن، زۆر زیاتر ئەگەری وەرگیرانت هەیە، بەراورد بەوەی کەس پشتگیریت نەکات، چونکە کاتێك یەکێك پێشنیازی بەرێزت دەکات، جۆرێك لەگرەنتی و دڵنیایی بە کۆمپانیا و دامەزراوەکە دەدات.

بوونی پەیوەندی تەنها بۆ دۆزینەوەی کار گرنگ نیە، بەڵکو بۆ هەر بوارێکی تر گرنگە، بازرگانەکان، سەرمایەدارەکان، سیاسیەکان، چالاکوانانی کۆمەڵگەی مەدەنی، هتد..... پەیوەندیەکانیان لە ئاستیکی بەرزدایە، جۆربۆشی سەرۆکی ئەمەریکا، شەوانە ٢ کاتژمێری تەرخان دەکرد بۆ پەیوەندی،

چەندە پەیوەندیەکانت بچنە سەرەوە ئەوەندە دەستکەوتەکانت زیاتر دەبن، بە پێچەوانەش ڕاستە.

## ٤- بزانیت بڕیاری دامەزراندن لای کێیە؟

زۆرێك لە دامەزراوەکانمان بەداخی زۆرەوە سیستەماتیکانە کـار نـاکەن، بڕیــاری وەرگرتن لە دامـــەزراوەیەکەوە بۆ دامەزراوەیەکی تر دەگۆڕێت، لە هەندێك دەزگا لای بەڕێوبەری جێبەجێکارە و خاوەن دەزگا حەقی بەسەر ئەم بابەتەوە نیە، لەهەندێك دەزگا بەبێ خاوەنی دەزگا بەڕێوبەری جێبەجێکار ناتوانێت هیچ کەس وەربگرێت، لەهەندێك دەزگا لای بەشی HR ە، لە هەندێکی تر لای بەشی کارگێڕیە، هتد....

پێش ئەوەی داوای دامەزراندن پێش کەش بکەیت، گرنگە بزانیت بڕیاری دامەزراندن لای کێیە؟ ئەگەر بڕیارەکە لای خاوەنی دامەزراوەکە بێت، هەرچەند داوا پێشکەشی بەڕێوبەر و بەشی کارگێڕی بکەیت، وەرناگیرێیت، هتد......

ئەوەی بڕیاری دامەزراندنی بەدەستە گرنگە بزانیت، چ جۆرە کەسایەتییێکی هەیە؟ چۆن بیردەکاتەوە؟ ڕوانینی بۆ کارمەندی باش چیە؟ چ جۆرە کارمەندیکی دەوێت؟ هتد.....

## ٥- لە بواری خۆتدا، زۆر سێرچ بکە و زانیاری کۆبکەوە

کارمەندی تەندروستیت و کارت دەستناکەوێت، ئەگەر تەنها لە ماڵی خۆتەوە سێرچ بکەیت بۆ نەخۆشخانە ئەهلیەکان لە کوردستان و ئاشنا بیت بەخاڵی بەهێز و لاوازیان، چالاکیەکانیان، جیاوازیان و زانیاریەکی زۆر کۆبکەیتەوە بۆئەوەی کاتێك داوای کارت کرد لە نەخۆشخانەیەك، ئەوەندە زانیاریت هەبێت، ئەوەندە خاڵی بەهێز و لاوازی نەخۆشخانەکان بزانیت، ئینجا دەزانیت چۆن قسە دەکەیت و چۆن پێشنیاز دەکەیت بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی دەتەوێت لێی وەربگیرێیت، زۆر ئاسانتر دەتوانیت قەناعەتیان پێبکەیت، نەك هیچ زانیاریەکت نەبێت لەسەر هیچ نەخۆشخانەیەك.



هەر لەماڵی خۆتەوە بەهۆی ئەنتەرنێتەوە دەتوانیت لەسەر ئاستی جیهان ئاگاداری نەخۆشخانە گەورە و نێودەوڵەتیەکان بیت و ممیزات و جاکەرەوە نایابەکانیان بزانیت و دواتر مەفهومێکت بۆ دروست دەبێت، زۆر ئاسانتر وەردەگیرێیت، چونکە شارەزایی زۆر پەیدادەکەیت، کاتێکیش وەردەگیرێیت بەکارەجوانەکانت، پێشنیازە نایابەکانت، کە بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوانەوە پێی گەیشتویت زۆر زوو شوێن دەستت لە نەخۆشخانەکە دەردەکەوێت.

پرسیارئەوەیە کەسێکی لەم جۆرە لەبواری خۆیدا قاڵبووبێتەوە، چەند جیاوازە لەگەڵ کەسێك نەزانێت لەجیهانی بوارەکەی خۆیدا چی دەگوزەرێت؟!

## ٦- ناردنی CV بۆ زۆرترین دامەزراوە :

دەکرێت CV بنێری بۆ زۆرێك لە کۆمپانیا و دامەزراوەکان، هەتا ئەگەر داوای کارمەندیشیان نەکردبێت، چونکە لە کاتی پێویست ڕەنگە بۆت بگەڕێنەوە، بەتایبەت ئەگەر CV یەکەت گرنگ بێت و لەگەڵ پێویستیەکانی ئەوان بێتەوە.



دەبێت لەکام بواردا بەهێزیت، لەو بوارەدا لە کار بگەڕێی و CV بنێریت، نابێت هەڕەمەکی لەکار بگەڕێیت، بۆ وێنە لە ناسینی خەڵك و جۆرەکانی کەسییێتی و پەیوەندیدا کارامەیت هەیە، گرنگە بۆ بەشی فرۆشتن یان ئەو بەشانەی پێویستیان بەو کارامەییانە هەیە، داواکاری پێشکەش بکەیت و گەڕانت بۆ دامەزراوەکان بۆ ئەو بەشانە بێت، با ئەزمونیشت نەبێت، بەڵام توانا و کارامەییەکانت وا دەکەن سەرکەوتووبیت و وەربگیرێیت.

چەندە داواکاری پێشکەش بکەیت زیاتر ئیحتیمالی وەرگرتنت هەیە، ئەگەر بۆ ١ کۆمپانیا داواکاری پێشکەش بکەیت و بەدیار ئەو داواکاریەوە دانیشیت، ئیحتیمالی وەرگرتنت زۆر کەم دەبێت، دانیشتن لە ماڵەوە و چاوەڕێکردن تا کۆمپانیا و دامەزراوەیەك لە دەرگات بدات و کارت پێبدات، یەکێکە لە کارە مەحاڵەکان، وەك خودا دەفەرموێت: ( وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى﴿٤٠﴾ ) نجم

واتە: (بە ڕاستی ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێك نیە، تەنها ئەوە نەبێت کەخۆی کردوویەتی (٣٩) بێگومان هەوڵ و کۆششەکەی دەبینێتەوە(٤٠))

ئەگەر کارێکت دەستکەوت لە بواری خۆتەوە دوور بوو، دەتوانی بیکەیت بۆماوەیەکی کاتی، لەبەر لایەنی ماددی تا ئەوکارە دەدۆزیتەوە کە حەزت لێیە و لەگەڵ تۆ دێتەوە.





## ٧- داوای پۆستێک یان کارێکی دیاریکراو بکە:

پێش داواکردنی کار، دەبێت بزانیت دامـــەزراوەکە لە چ پۆستێك و کارێکدا کەموکورتیان هەیە، ئینجا داوای کارێکی دیاری کراو بکەیت، وەدەبێت توانا و کارامەیت بۆ پۆست و کارەکە هەبێت.

زۆرێك لەوانەی ڕەتدەکرێنەوە، بەدیاری کراوی نازانن چیان دەوێت و چیان پێیە، وە دامەزراوەکەش نازانێت بۆ چ کارێکیان وەربگرێت.

دەتوانیت چی پێشکەش بکەیت و بەرنامەت چیە و چۆن کارەکە پێش دەخەیت و چیان بۆ دەکەیت، باسی بکە. ئەگەر دامەزراوەکە نەیزانی بۆ چ کارێك باشیت و چ کارامەییەکت هەیە و چیان بۆ دەکەیت ،چۆن وەرت بگرن؟

## ٨-بە کاری خۆبەخشی تەحەددای ئەوە بکە، دەتوانیت کاری گرنگ بکەیت:

کاتێك خاوەن کارامەیت و بەرنامەت هەیە و بە توانایت، دامەزراوەکان زۆر بەئاسانی ڕازین کاریان لەگەڵ بکەیت بە خۆبەخشی، ئەگەر سەرکەوتوو بویت، خۆیان داوای دامەزراندنت لێدەکەن، ئەگەر سەرکەوتوو نەبوویت، دەبێت بە خۆتدا بچیتەوە،



**کەموکورتی و هەڵەکە لە کوێ بووە، بۆئەوەی بە شێوازێکی تر و باشتر بێیتەوە مەیدانەوە، دەتوانیت داوای ٢-٣ مانگ بکەیت وەك تەحەددایەك بۆ خۆسەلماندنت کە دەتوانیت چیان بۆ بکەیت.**

قسەیەکی زانایەك زۆر کاری تێکردم، کە دەڵێت: هەموو کۆمپانیاکان لە کەسێك دەگەڕێن، کە بتوانێت شتێکی بەنرخیان پێببەخشێت، ئەگەر بیرۆکە، خزمەتگوزاری یان هەرشتێکی تر بێت، وە هەموو کۆمپانیایەك شوێنی هەیە بۆ کەسێك کە پلانێکی ڕوونی کرداری هەبێت، کە لە قازانجی کۆمپانیاکە بێت، پرسیار ئەوەیە بەڕێزت چ شتێکی گرنگت پێیە بۆ کۆمپانیا و دامەزراوەکان؟

# چاوپێکەوتن



پێش ئەوەی بچیت بۆ چاوپێکەوتن، دەبێت ئەرزش و بەهای کەسی خۆت، لەگەڵ ئەرزش و بەهای بەرهەمەکەت بزانی، بۆئەوەی لە ناخەوە متمانەت بەخۆت هەبێت و لە کاتی چاوپێکەوتندا سەرکەوتوو بیت. ئەگەر ئەرزش و بەهای خۆت و بەرهەمەکەت نەزانی، کاتێك چویە بەردەم خاوەن کۆمپانیایەك بۆ چاوپێکەوتن نەبرە و زمانی جەستەت لاواز دەردەکەوێت و متمانەت بەخۆت نابێت، بەرامبەریش بەلاواز تێتدەگات.

## چۆن ئەرزش وبەهای کەسی خۆت دەدۆزیەوە؟

لە دەفتەرێکی تایبەتدا یان کۆمپیتەرەکەت ئەرزش و بەهای کەسی خۆت دەنوسی بەنموونە:-

- ڕاستگۆیت.
- نهێنی پارێزیت.
- دڵسۆزیت.
- ماندونەناسیت.
- هتد..... هەموو بەهاکانت و تایبەتمەندیە باشەکان دەنوسیت هەرچەند بن.

دواتر ئەرزش و بەهای بەرهەمەکەت دەنوسیت، بەنموونە مامۆستای بیرکاریت وەك:

- بابەتەکە جوان بۆ قوتابیان شی دەکەیتەوە.
- بەردەوام خۆت زیرەك و بە توانا دەکەیت لەبوارەکەی خۆتدا.
- بە پراکتیکی فێریان دەکەیت.
- هەموو هۆکارە فێرکاریەکان بەکاردەهێنیت.
- جیاوازی تاکایەتی بەکاردەهێنیت (بەپێی جیاوازی قوتابیەکان ڕەفتار دەکەیت).
- هتد.....

کاتێك ئەرزش و بەهای خۆت و بەرهەمەکەت نوسی و چوویت بۆ چاوپێکەوتن، ئەگەر گەورەترین بەڕێوبەری کۆمپانیاییێکی ئەم جیهانە چاوپێکەوتنت لەگەڵ ئەنجام بدات، ناترسیت و متمانەی زۆرت بە خۆت دەبێت و لە زمانی جەستەشتەوە دەردەکەوێت، بەرامبەریش هەستی پێدەکات و بەگرنگ سەیرت دەکات.

زۆر گرنگە چەندین جار پێش چاوپێکەوتن بە چەند ڕۆژ ئەرزش و بەهاکانت بخوێنیتەوە، تەنانەت لە پاش وەرگیرانیشت یان هەر کاتێکی تر، خوێندنەوەی ئەرزش و بەهاکانت کاریگەری زۆری لەسەر متمانە بە خۆبوونت دەبێت.

لەکاتی چاوپێکەوتندا ڕواڵەتی باش گرنگە بۆ وەرگرتن، سەیری چاوەکانی بکەیت، لە ڕووی زمانی جەستەوە زۆر باش بیت، بوونی پەرۆشی و حەماسەتت بۆکارەکە زۆر پێویستە، ئەگەر کەسەکە هیچ پەرۆشی و حەماسەتی پێوە دیار نەبێت کە چەندە ئەو کارەی خۆش دەوێت، سەرنجی بەرامبەر ڕاناکێشێت.

جل و بەرگ دەبێت زۆر گونجاو بێت، ئەگەر چاوپێکەوتنت بۆ پۆستی بەڕێوبەری بێت، دەبێت جل و بەرگت فەرمی بێت، بۆ یانەیەکی وەرزشی دەبێت جل و بەرگت وەرزشی بێت، بۆ کاری خزمەتگوزاری، نابێت بە چاکەت و پانتۆڵەوە بچیت، هتد....

پێش چاوپێکەوتن، دەبێت CV یەکەت زۆر بخوێنیتەوە و وەڵامی هەموو پرسیارەکان بزانیت، زۆر جار ئەوانەی چاوپێکەوتن ئەنجام دەدەن پرسیاری زۆر لەسەر CV دەکەن، بۆ وێنە ٤ ساڵ پێش ئێستا بەژداری کۆرسێکت کردووە و زۆر بیرت

نەماوە باسی چی کرا، ئەم کەسەش پرسیارت لێدەکات، باسی ئەو کۆرسەمان بۆ بکە سالّی ئەوەندە بەشداریت کرد، یان باسی فلّان شتەم بۆ بکە کە لە CV یەکەتدا ئاماژەت پێداوە، چەندان پرسیاری لەم جۆرە.



لەکاتی چاوپێکەوتندا نابێت بەهیچ جۆرێك باسی عەیب وعاری بەڕێوبەر و دەزگای پێشوو بکرێت، چەندە بە خراپە باسی دامەزراوەی پێشتر بکرێت، ئەوەندە زیاتر بۆچونی خراپ لەسەر کەسەکە دروست دەبێت. زۆر جار بە مەبەستەوە پرسیار دەکرێت لەبارەی دامەزراوەی پێشتر(بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدەدەن)، بەگشتی کاتێك نهێنی خەڵك دەپارێزین، بەرامبەر باشتر متمانەمان پێدەکات، پێچەوانەکەشی ڕاستە.





هەموو کۆمپانیایەك یاسای تایبەتی خۆی هەیە بۆ وەرگرتنی کارمەند، چ کەسێك بێت؟ تایبەتمەندی چۆن بێت؟ هتد.... ئەگەرتایبەتمەندی و مەرجەکان بزانیت و بە پێی ئەوە خۆت ڕێکبخەیت زۆر بەبایەخە، بەپێچەوانەشەوە ئەو تایبەتمەندیانەی دامەزراوەکە داوای کردووە لە تۆدا نەبێت، وەرگیرانت ئەستەمە.

ئەگەر CV یت بەهێزبوو، زۆر چوویت بۆ دۆزینەوەی کار و پێیان نەدایت، لە کاتێکدا کارامەیی و توانات هەبوو، دیارە گرفت هەیە لە چاوپێکەوتنەکانت یان لە گەڕان بە دوای شوێنی مەبەستدا .

# گرنگرتین ئەو پرسیارانەی کۆمپانیا و دامەزراوەکان دەیکەن چین؟



## ١- باسی خۆت بکە، لەخۆت بدوێ، هتد....

دەبێت باسی ئەو خاڵ و جیاکەرەوانەی خۆت بکەیت کە هەماهەنگ و گونجاوە بۆ دەزگاکە و سود و قازانجی هەیە بۆیان.

دەبێت باسکردنەکە ڕاستگۆیانە بێت (خوانە خواستە، نابێت شتێك بڵێین وانە بێت). دەبێت خاڵە بە هێز و کارامەییەکانت کە سەرنجی کۆمپانیا و دامەزراوەکە ڕادەکێشێت باس بکەیت. بەکورتی باسی خۆت بکەیت، ئەوەی لەگەڵ ئەوان دێتەوە و گونجاوە، باسی کارامەیی و تواناکانت بکەیت، چ کارێکی جوانت



کردووە لە ڕابردودا پەیوەندی بەوکارەوە هەیە کە داواتکردووە، وە چ بەرنامەیەکت بە دەستەوەیە بۆ بەرەوپێش بردنی ئەم کارە.

## ٢-بۆ ٥ ساڵی تر (بۆ نموونە) بەرنامەت چیە بۆ ئەوکارە؟



ئەگەر وەڵامەکە بە جۆرێك بێت بڵێیت: دەبمە بەڕێوبەر، یان هەموو شتەکان کۆنترۆڵ دەکەم و دەیخەمە ژێر دەستی خۆمەوە ئەوە جۆرێکە لە تەهدید و بەهیچ جۆرێك قبوڵی ناکەن.

ئەم پرسیارە بۆ زانینی ئەوەیە تا چەندە خاوەن بەرنامەیت، یان هەرکە کارێکی باشترت دەست کەوت، دامەزراوەکە جێدەهێڵیت. لەوەڵامتدا دەردەکەوێت، چەندە بە پەرۆشی و خاوەن بەرنامەیت یان هیچ شتێکت نیە و تەنها دەتەوێت کارت دەست بکەوێت.

**باس کردنی ئەمانە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر سەرنج ڕاکێشە:**

- بوونی نەخشە و پلانت بۆ پێشخستنی کارەکە و کۆمپانیاکە.
- ئەزمون و خیبرەی پێشترت (ئەگەر هەتبێت) بۆ ئەم کارە.
- نەخشەت بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوەی ئاڵنگاریەکان(تحدیەکان).
- ئەگەر ئەزمونت هەبێت، پێشتر چۆن ڕووبەڕووی ئاڵنگاریەکانی کار بوویتەوە و چارەسەرت کردوون.



خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە، کۆمپانیاکان حەز ناکەن کار بدەن بە کەسێك کە خاوەنی هیچ بەرنامەیەك نەبێت، ئەوە پرسیارێکی جەوهەریە لە کاتی چاوپێکەوتن دامەزراوەکان دەیکەن بۆ هەڵسەنگاندنی ووردی کەسەکە ئاخۆ چی پێیە؟ چەند خەمخۆر و دڵسۆزە؟ دەیەوێت چی بکات؟ ئایا تەنها دەیەوێت کارێکی دەست بکەوێت یان خاوەن مەبدەئو بەرنامەیە و دەمێنێتەوە؟ وەڵامت بۆ ئەم پرسیارە چانسێکی بەهێزت پێدەدات بۆ وەرگیران یان ڕەتکردنەوەت.

ئەو کەسانەی بە هێزن و ئاسان وەردەگیرێن، پێشتر ئامادەکاری تەواو دەکەن بۆ داڕشتنی بەرنامەیەکی بەهێز بۆ بەرەوپێش بردنی کۆمپانیا و دامەزراوەکە.

## ٣- خاڵە بەهێزەکانت چین؟



باسی ٢-٣ کارامەیی بکە کە لەگەڵ ئەو موقعە دەگونجێت کە لە تۆدا هەیە، بۆ وێنە دەتەوێت ببیت بە مەندوب، ئەو کارامەییانەش لەتۆدا بەهێزن (هونەری ڕازیکردن ، گفتوگۆکارێکی سەرکەوتوو، پەیوەندی چالاك، بوونی پەیوەندی فراوان لە گەڵ خەڵك، هتد....) باسکردنی ئەو کارامەییانە چانسی وەرگیرانت بەهێزتر دەکات، پێویست ناکات باسی ئەوە بکەیت لە بەرنامەکانی کۆمپیتەردا لێهاتوویت، چونکە ئەو کارە پێویستی بەو کارامەییە نیە.





## ٤- خاڵە لاوازەکانت چین؟

باسی خاڵی لاوازت بکە، کە هیچ پەیوەندی بە دەزگاکەوە نەبێت، بۆ وێنە تۆ پەرستاری و داوای کار دەکەیت لە نەخۆشخانەیەکی تایبەت، باسی خۆت دەکەیت کە لە IT و کۆمپیتەردا باش نیت، ئەوە هیچ کاریگەری نابێت لەسەر وەرگیرانت، چونکە کاری تۆ پەیوەندی بە ITوە نیە.

یاخود باسی خاڵی لاوازی خۆت دەکەیت کە لای بەرامبەر خاڵی هێزە، وەك ئەندازیاری کارەباییت و داوای بەشی کارەباییات کردووە لە دامەزراوەیەك، باسی ئەوە دەکەیت خاڵی لاوازت ئەوەیە، زۆر تەئکید لە پاراستن و سەلامەتی ئامێرەکان دەکەیتەوە، تۆ بە خاڵی لاواز باسی دەکەیت، بەڵام خاڵی بەهێزە لای ئەوان و حەز بە کارمەندێکی لەم جۆرە دەکەن.

## ٥- چ شتێک دەزانیت دەربارەی کۆمپانیاکەمان؟

ئەوە هەڵسەنگاندنە بۆ جدیەتی تۆ، بۆئەوەی بزانن چەندە حەزت لەم کارەیە و لێکۆڵینەوەت کردووە؟ ئایا بە هەڕەمەکی داوات کردووە، یان دیراسە کراو بووە.

ئەوانەی چاوپێکەوتن ئەنجام دەدەن بێزار دەبن، کاتێك ئەوەی داوای کاری کردووە، هیچ زانیاریەکی لەسەر کۆمپانیا و کارەکە

نیە، بۆیە کاتێك کارێك ڕادەگەیەنرێت، بەبێ هیچ زانیاریەك بچیتە چاوپێکەوتنەوە، زۆر جیاوازە لە وەی زانیاری زۆر کۆبکەیتەوە.



زانیاری هێزە بۆ مرۆڤ، نەبوونی زانیاری لەسەر دامەزراوە و کۆمپانیاکە، مانای بە گرنگ نەزانینیەتی و نەبوونی پەرۆشی و خەمخۆریە، کۆمپانیاکانیش نایانەوێت کەسێك وەربگرن هیچ زانیاریەکی نەبێت لەسەریان.

زۆر سەرنجڕاکێش دەبێت چ لە ڕێگەی هاوڕێوە، یان لە ڕێگەی سۆشیال میدیا و وێب سایت و هەر شتێك کە کۆمپانیا و دەزگا هەیەتی، زانیاری زۆر وورد و دەقیق کۆبکەیتەوە، بۆ نموونە کارگەیەکی ماست هەیە و دەتەوێت لەوێ کار بکەیت، ئەگەر بزانیت ساڵی چەند دامەزراوە، جۆری ماستەکەی چۆنە، چەند جیاوازی هەیە لەگەڵ بەرهەمی کارگەکانی تر، خاڵی بەهێز و لاوازی چیە، پەیام و بەهای چیە، زۆر جیاوازە لەوەی هیچ زانیاریەکت نەبێت.



بوونی زانیاری مانای پەرۆشی و خەمخۆریتە ، بەم زانیاریانە وەك بەشێك لە كارگەكە دەناسرێیت و لە سەرەتاوە كۆنتاكتیان لەگەڵ دەكەیت، جگە لەوەی بەپێی ئەو زانیاریانە بۆ چاوپێكەوتن خۆت ئامادە دەكەیت.



## ٦- بۆدەتەوێت لەلای ئێمە کار بکەیت؟

هەلێكی ئاڵتونیە بۆئەوەی تەعبیری لێبكەیت كە بۆچی دەتەوێت لەم دامەزراوەیە كار بكەیت، ئەوان دەیانەوێت هۆكاری سەرەكی بزانن كە بۆچی دەتەوێت لەم دامەزراوەیە كار بكەیت، دەرفەتێكی زۆر باشە مدحی( بە ڕاستگۆیی) بەرهەم یان شتە باشەكانی دامەزراوەكە بكەیت.وە باسی بەرنامەی خۆت بكەیت بۆ پێشخستنی ئەو كارەی داوات كردووە.

## ٧- بۆچی تۆ وەک کارمەندێک وەربگرین؟

دەیانەوێت بزانن بۆچی تۆ بۆ ئەم كارە دیـــاری بكەن؟ چ جیاكەرەوەیەك هەیە لە تۆدا و لە ئەوانی تردا نیە.

دەرفەتێكی باشە باسی ئەو جیاكەرەوانە بكەیت كە لە تۆدا هەیە بۆ ئەو كارە و دەتوانی شتی جوان بكەیت، چونكە ئەوان چەندین كەسی جیاوازیان هەیە، بەڵام دەیانەوێت هەڵبژاردن بكەن بۆ دیاریكردنی باشترین كەس، ئەم پرسیارە دەرفەتت پێدەدات





سەرنجیان ڕاکێشیت بۆ سەرخۆت. (ئەگەرئەم پرسیارەش نەکرا، دەبێت بە جۆرێك لە جۆرەکان ئاماژە بە هەندێك شت بکەیت بۆ ئەوەی سەرنجیان ڕاکێشیت).

## ٨- باسی کێشەیەک بکە کە لەژیانی پیشەییت توشی بوویت و چۆن بەسەریدا زاڵ بوویت؟

ئەوەی پرسیار دەکات جگە لەوەی دەیەوێت بزانێت چۆن چارەسەری کێشە دەکەیت، دەیەوێت بشزانێت لە کاری تیم وۆرکدا چۆنی و چۆن پشت بە تیم وۆرك دەبەستیت؟ زۆر سەرنج ڕاکێش دەبێت تەرکیز بخەیە سەر ئەو کارامەییانەی تیم وۆرك کە لە تۆدا بوونی هەیە.

ئەگەر چیرۆکێکت لابێت لەژیانی کارکردندا، کە کێشەیەکت چارەسەر کردبێت، وە ئەو تایبەتمەندیانەت تێدا دەربخات کە ڕووحی تیم و بە یەکەوە کارکردنت تێدایە، زۆر نایاب دەبێت.

## ٩- تۆ هیچ پرسیارێکت هەیە لە ئێمە؟

نابێت بەنەخێر وەڵام بدرێتەوە، ئەگەر بە نەخێر وەڵام درایەوە، یانی:

١- کەسەکە گرنگی بەو کارە نادات.

٢- حەز لەو کارە ناکات.



٣- کەسێکی بێبەرنامەیە

٤- هتد........

بۆئەوەیە بزانن ئەو دامەزراوەیە بە لای تۆوە گرنگە کاری تێدا بکەیت یان نا، چونکە کەسانی خاوەن بەرنامە و لێهاتوو بە پەرۆش، گرنگی بە کاری خۆیان دەدەن و پرسیار دەکەن و دەیانەوێت بەرچاو ڕوون بن، دەکرێت یەك لەو پرسیارانەی بیکەیت ئەوە بێت ڕۆتینی ڕۆژانەی ئەم کارە چیە؟ هتد......

## ١٠- ڕەنگە پرسیاری موچەت لێبکەن و بپرسن داوای چەند موچە دەکەیت؟

هەندێك سەرچاوە دەڵێن، بڵێ من دەمەوێت خزمەت بکەم و بەشێك بم لەبەرەو پێشبردنی دەزگاکە و بە گوێرەی داهاتتان دەتوانن موچەکەم پێبدەن، سەرچاوەی تر هەیە ڕای وایە خۆت لە پرسیارەکە نەدزیتەوە و وەڵام بدەیتەوە.




پێش چاوپێکەوتن دەبێت زانیاری تەواوت هەبێت لەسەر ئەم دامەزراوەیە، ئەگەر دامەزراوەیەکی پرۆفیشناڵ بێت، لە سۆشیال میدیا و وێبسایتیاندا سیستەمی موچە دیارە، ئەگەر

پرۆفیشناڵ نەبێت و سیستەمی موچە دیار نەبێت، دەتوانیت پێشتر بە بەدوادا چوون و پرسیارکردن لە کارمەندەکان زانیاری وەربگریت، گرنگە هەمان کار و پۆست لەو دامەزراوەیەی داوای دامەزراندن دەکەیت بزانیت موچەی چەندە، گرنگە بزانیت بەهای کارامەیی و نرخی پۆستەکەت چەندە، تا کارامەیت ناوازەتر بێت گرنگترە و ئاساییە داوای پارەی زیاتر بکەیت، بۆ وێنە بۆ هەمان پۆست ٧٠٠$دراوە، تۆ داوای ١٠٠٠$ بکەیت، چونکە دواتر گفتوگۆ دەست پێدەکات.

ئەگەر زانیاریت نەبێت، ڕەنگە ڕێژەیەکی کەم بڵێیت یان زۆر زیاتر بڵێیت، بوونی زانیاری وادەکات داوای ڕێژەیەك بکەیت زۆر گونجاو بێت و حەقت نەفەوتێت، بۆ وێنە بڵێیت لە نێوان ١٠٠٠$ بۆ١٧٠٠$، ئەگەر ١٠٠٠$ بوو، بڕی کەمەکە دیاری کرا تۆ پێشتر زانیاریت کۆکردۆتەوە کە سیستەمی موچە چۆنە، خۆ ئەگەر ٢٠٠٠$ یان لەنێوان ئەو دوو ژمارەیەدا بوو، زۆر گونجاوە.

دەگەڕێتەوە سەر زیرەکی کەسەکە، ئەگەر کەسێك داوای کار بکات بۆ چێشتخانەیەك و موچەی هەر کەسێك ٥٠٠$ بێت، ناکرێت ئەو داوای ١٠٠٠ $ بکات، ڕەنگە ئەم داوا کردنە ببێتە هۆی ڕەتکردنەوەی، ئەگەر چێشتلێنەرێکی لێهاتوو بێت، بتوانێ بازاڕ بۆ چێشتخانەکە دروست بکات، ئەگەر چێشتلێنەرەکانی تر موچەیان ١٠٠٠$ بێت، ئەو دەتوانێت داوای ١٥٠٠$ تا ٢٠٠٠$ یان زیاتریش بکات، شوێن و جۆری کارەکە و کارامەیی و لێهاتوویی کەسەکە هەموویان بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن.



ئەگەر کارامەیی باشت هەبێت، دەتوانیت گفتوگۆ بکەیت لەسەر موچە و بەرامبەر باشتر ڕێزت دەگرێت و حسابت بۆ دەکات کە خاوەن بەرنامەی خۆتی، بەڵام ئەگەر هیچ مەرجێکت نەبێت بە لاواز سەیرت دەکەن.



## ١١- بۆچی دەتەوێت لەم کارە وەربگیرێیت؟ ئەو بەرهەم و دەستکەوتانەی دەتەوێت پێشکەشی بکەیت چین؟

ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە لە لای خۆتەوە لاوازبێت و نەزانیت بۆ دەتەوێت وەرتبگرن، لە کاتی چاوپێکەوتندا زۆر متمانەت بە خۆت نابێت و زمانی جەستەت لاواز دەبێت، بەڵام ئەگەر وەڵامی (بۆچیەکەت) زۆر بە هێز بێت، لای خۆتەوە ڕوون بێت، کە چەندین بەرهەم پێشکەش دەکەیت و کارەکە پێش دەخەیت و بەرنامەت هەیە، زۆر متمانەت بە خۆت دەبێت و بەرامبەریش بە ئاسانی هەستی پێدەکات.

بۆ وێنە دەتەوێت ببیتە کارمەندی هوتێل و هەستت کردووە میوانەکان بەڕێز و قەدرەوە خزمەت ناکرێن و پێشوازی لێناکرێن، بەرنامەی تایبەتت هەیە دەتەوێت بە جوانترین شێوە پێشوازی لە میوانەکان بکەیت و خزمەتیان بکەیت، زۆریش بە پەرۆشی لەم هوتێلە وەربگیرێیت، بەراورد بەوەی هیچ بەرنامەیەکت نەبێت و وەڵامی (بۆچیەکەت) لاواز بێت کە نەزانیت بۆچی وەرتبگرن زۆر جیاوازە.

## ١٢- بۆچی کاری پێشوت وازلێهێنا؟

ئەگەر کەسەکە دەست بکات بە باسکردنی لاوازی و کەم و کورتیەکانی بەڕێوبەر و کۆمپانیا و دامەزراوەی پێشتر، ڕوانینێکی خراپی لەسەر دروست دەبێت، لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبێت ڕاستگۆ بین، ئاماژە نەدان بە کەم وکورتی دامەزراوەی پێشتر، ئەوە ناگەیەنێت ئێمە ڕاستگۆنین، چونکە هیچ پێویست ناکات باسی بابەتێکی نا پێویست بکەین.



هەڵبژاردنی وەڵامـــی هاوشێوەی ئەوانەی خـــوارەوە زۆر باش دەبێت (بە کرداریش ئەو وەڵامانە بێت وایکرد بێت ئەو دامەزراوەیە هەڵبژێریت):

- لێرە شوێنی کار لە ماڵمانەوە نزیکترە.
- بواری گەشەکردن و فراوان بوون لێرە زۆر باشترە.
- ئەم کارەی ئێستا زیاتر لەگەڵ خەون و ئاواتی من دێتەوە.
- بەرنامەی تایبەتم هەیە، ئەم دامەزراوەیە پێش بخەم.
- دەمەوێت ئەزموونی نوێ وەربگرم.
- هتد......



## ١٣-هیوایەتت چیە؟ کام وەرزشە دەکەیت؟

دەیانەوێت بزانن چەندە کارامەییت هەیە لە دەرەوەی کارەکەت، ئەگەر یاری شەترەنج بکەیت، بەواتای کارامەیی شیکارکردنت بەهێزە، ئەگەر حەزت لە مۆسیقا و وێنە و خوێندنەوە بێت، لایەنی داهێنانت بەهێزە، ئەگەر حەزت لە وەرزشی تاکەکەسی بێت، کارامەیی دیزاین و تصمیمت بەهێزە، ئەگەر حەزت لە وەرزشی بەکۆمەڵ بێت، ئامادەی کاری بە کۆمەڵ بکەیت و ئامادەی ببیت بە بەشێك لە تیم.



## خۆئامادەكرن بۆ چاوپێكەوتن



مەشق و ڕاهێنان بکە، بۆ ئەو پرسیارانەی لێتدەکرێن، ئەو پرسیارانە بنوسە کە ڕەنگە لێتبکرێن، ڕەنگە کۆمەڵێك پرسیارت ئاراستە بکرێت لەبارەی ئەزموون و کارامەیی (موئهلات).

### لەگەڵ هاوڕێکەت مەشق بکە ، بۆئەوەی :

- ڕابێییت.
- ترست نەمێنێت.
- فێربیت ئەوەی گرنگە بیگەیەنیت، چونکە ئەوەی گرنگە، دەبێت لانی کەم لە ماوەی ١٥ خولەکدا بیگەیەنیت.
- زمانی جەستەت ڕێك دەبێت.

• نەبرە و شێوازی قسەکردنت باشتر دەبێت.



• چــەندە زیاتر مەشــق بکەیت، ئەوەندە بابەتەکە دێتە ناخــتەوە و باوەڕت بە توانا و کارامەییەکانت زیـــاتر دەبێت و لە کــاتی وەڵام دانەوەی پرسیارەکان، هەم بەجۆش و خرۆشەوە قسە دەکەیت، هەم ئێ ئێ و ئا ئا ئا ... ئەوانەت کەمتر دەبێتەوە.

• هتد ......

**ئە م پرسیارانەی خوارەوەش زۆر جار دەکرێن، دەبێت بە تەواوی خۆتیان بۆ ئامادە بکەیت:-**

• چ شتێك دەتوانی ئەنجام بدەیت و خەڵکی تر ناتوانن ئەنجامی بدەن؟

• ئەو کارامەیی و لێهاتوویانەت چیە کە تایبەتن بەم کارە؟

• چ شتێك لەکاری پێشترت فێربوویت؟

• گەورەترین بەرپرسیاریەتی پێشتر وەرتگرتبێت چیە؟

• ئەو کارامەییانە چین بە دەستت هێناوە یاخود بە کارت هێناوە لە کاری پێشترتدا و پەیوەندی هەیە بەوکارەی دەتەوێت وەریبگریت؟

- ئەو کارامەیی و توانـا تــازانە چین، کە بەم زووانە دەستت خستووە؟
- نمونەیەکمان بدەیێ لە سەرکاری پێشترت، کە تواناکانت بە کارهێناوە و شتی جوانت کردووە؟
- گرنگترین شت لە کاردا سەبارەت بە تۆوە چییە؟
- هتد... .



ئەم پەرتوکەی بەردەستت لە ئەنجامی شەونخونی و توێژینەوەی مەیدانی و دەیان سەرچاوەی عربی و ئینگلیزی و لێکۆڵینەوە لەوانەی کاریان دەستکەوتووە، هتد... لە دایك بووە، دڵنیات دەکەمەوە، نەك هەموو تەکنیکەکان، ئەگەر تەنها چەند تەکنیکێك بەکار بهێنیت، کارت دەست دەکەوێت، دەمەوێت بڵێم، ئەگەر بەهۆی ئەم پەرتوکە کارت دەست کەوت و تا ژیانت بە کارمەندی مایەوە، داوا لە خودا دەکەم لێمخۆش بێت، چونکە زوڵمێکی گەورەم لێتکردووە، تۆ دەبێت تەنها بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کارمەند بیت و دواتر بیر لە کار و بزنس و پڕۆژەی خۆت بکەیتەوە، ئێمەش وەك دامەزراوەی LEAD (کە لە کۆتا پەڕە هەموو لینکەکان دانراون بۆ ئاگاداری لە کۆرس و بەرهەمی نوێ) بە هەموو شێوەیەك دەستت دەگرین، بۆئەوەی بە خەونەکەت بگەیت، چونکە زۆر ئاسانترە لەوەی بیری لێدەکەیتەوە.

گرنگی ئەم پەرتوکە لەوەدایە، نەك تەنها بۆدەست کەوتنی کارە، بەڵکو بەشێك لە تەکنیکەکانی بەتایبەت ئەو تەکنیکانەی

باس لە خۆپێگەیاندن و سۆشیال میدایا وسێرچ و هتد..... دەکەن، لە بواری خۆتدا ئەگەر بەردەوام بیت لەسەریان دوای دەستخستنی کار، ڕۆژ بە ڕۆژ بیرکردنەوەکانت گەورەتر دەبێت و بیر لەوە دەکەیتەوە ببیە خاوەن بزنسی خۆت، بە پێچەوانەوە هەر کە کارت دەست کەوت، وازبهێنیت لە خۆپێگەیاندن و فێربوونی کارامەیی نوێ، دەبێت تا ژیانت ماوە بە کارمەندی بمێنیتەوە، ئەوەش جۆرێکە لە ژیانێکی کولە مەرگی و ژێردەستەیی. بۆیە کاتێك کارت دەست کەوت دەبێت زۆر بە ئیتقانەوە بیکەیت.

پێغەمبەرمان (صلی اللە علیە وسلم) دەفەرموێت: (إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملاً أن يتقنه) واتە: (بە ڕاستی خوای گەورە ئەوەی خۆش دەوێت، کاتێك یەکێك لە ئێوە کارێکی کرد، زۆر بە نایابی و ڕێکی بیکات) .

خاوەن کارگەیەك بۆی باسکردم لە کۆی ٢٠ کەس کە وەکو تێست وەری گرتون، تەنها ٢ کەسی هێشتۆتەوە، کاتێك هۆکاری ئەوەم لێپرسی بۆ ئەو دوانەی هێشتۆتەوە، ووتی: ئەوانە کاریان بەکاری خۆیان دەزانی، کە دەچونەوە ماڵەوەش لە سۆشیال میدیاکانی خۆیانەوە، بەرهەمەکانی کارگەکەمیان بڵاو دەکردەوە و دەیانناساند، ئەوەندە بە جوانی کار دەکەن هەست دەکەیت خاوەنی کارگەکەن.

لەکاتی توێژینەوەمدا گفتوگۆم کرد لەگەڵ باخەوانێك (کە بەردەوام تەلەفۆنی بۆ دەهات بۆئەوەی باخچەیان بۆ دروست بکات)، لێمپرسی نهێنی چیە ئەوەندە کارت دەست دەکەوێت؟





ووتی: هەر باخچەیەك بكەم، بە هەموو توانامەوە ئەوپەڕی سەلیقەم بەكاردەهێنم و چۆن بۆخۆم كار دەكەم ئەوا دروستی دەكەم.

كاتێك سەیرم كرد، ڕاگەیاندنی لاوازە، بەڵام وەك خۆی ووتی: كاتێك كاردەكەم بۆهەركەسێك، ئەم كەسە ژمارەكەم دەدات بە خەڵكی تر و هەمان خەڵك دەبنەوە ڕیكلام بۆم.

بۆم دەركەوت، ئەم كەسە ئێستا هاتۆتە قۆناغی ئەوەی پیشەكەی بكاتە بزنس و تەنها سەرپەرشتی بكات، بەڵام ئێمە ٢ گرفتمان هەیە كە لە كۆرسی «داهێنان لە كار و بزنسەكەتدا بكە» چارەسەریان دەكەم، هەم:

١- بیركردنەوەكانمان لە سنووری تەسكدا قاڵبی گرتووە و بچووكە و متمانەمان بەخۆمان نیە، بەپێچەوانەی ئەوانەی كاری مەزن و بزنسی گەورە دەكەن.

٢- نەزانینی تەكنیك و كارامەیی (كە دەكرێت هەموو كەسێك فێری ببێت).

قسەیەكی ئاڵتونی هەیە دەڵێت: ئەگەر هەر كەسێك لەم جیهانەدا بتوانێت كارێك بكات، ئەوا هەركەسێكی تریش دەتوانێت هەمان كار بكات، بەمەرجێك حەزی لە كارەكە بێت و وەك ئەو بیكات.

## لەکۆتایدا



سروشتی پەروەردە و پێگەیاندنی تاکی ئێمە لە خێزان و قوتابخانە و زانکۆ و کۆمەڵگادا، وایکردووە تاکی ئێمە چاوەڕێبێت ڕووداوەکان ڕوو بدەن، بۆیە ئەوەندەی کارتێکراوە، ئەوەندە کارتێکەر نیە، ئەوەندەی کارلەسەر کراوە، ئەوەندە بکەر نیە، ئەوەندەی لە پەراوێزدایە ئەوەندە خولقێنەری دەرفەت و ژیانی خۆی نیە.

ڕووحی دەستپێشخەری لەئێمەدا کوژراوە، ئەوەندەی بە دیار چاوەڕوانیەوە دادەنیشین شتەکان ڕوو بدەن، ئەوەندە بیرلەوە ناکەینەوە شتەکان چۆن ڕوو بدەن، ئەمەش جیاوازییێکی زۆرمەزنی کەسە سەرکردەکانە کە وادەکەن ئەوەی دەیانەوێت ببێت، بەڵام خەڵکی ئاسایی تەنها تەماشاکەر و چاوەڕوانن چ شتیك دەبێت.

هەموو ئەوانەی لە مێژووی دوور و نزیکدا کاری مەزنیان کردووە، دەرفەتیان خولقاندووە و زۆر جار نەك بارودۆخەکان لەبار نەبوون، بەڵکو بارودۆخەکان زۆر دژوار بوون، ئەوان کۆڵیان نەداوە، حسنی کوڕی هەیسەم کە وێنەی لەسەر ١٠ هەزاری کۆن هەیە، نمونەیەکی جوانە، حسن کە بە باوکی ڕووناکی ناسراوە، مەگەر دەست بەسەرنەبوو(بەبێتاوانی) بۆماوەی ١٠ساڵ، بەڵام





تەنها لە ژوورەکەیدا خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە ڕووناکی و دواتر کۆمەڵێ شتی دۆزیەوە کە پەرتوکەکەی بۆ ماوەی ٥٠٠ ساڵ لە زانکۆکانی ئەوروپا دەخوێنرا، وەك سەرچاوەیەکی زۆر مەزن لە بواری ڕووناکیدا.

هەر کەسێکی مەزن پێی سەرسامیت، چ کوردی خۆمان بێت یان بیانی، بچۆ ژیانی بخوێنەوە، خۆی لاپەڕە پڕشنگدارەکانی خۆی نەخشاندووە، خۆی بۆتە بەتەڵی ژیانی خۆی، خۆی بۆتە کاپتنی کەشتی خۆی، خۆی مـــێژووی ژیـــانی نوسیوەتەوە و بەدیار ڕووداوەکانەوە دانەنیشتوە بۆی بنوسنەوە، چونکە مرۆڤە گەورەکان ئامادەنین لاپەڕەکانی ژیانیان ئەو شتانەی تێدا بێت کە حەزی پێناکەن، دەبێت پڕبێت لەو دەرفەت و دەستکەوتانەی خۆیان نەخشەی بۆ دادەنێن، ئەوان ئەندازیار و نەخشەسازی ژیانی خۆیانن.

منیش خەون بەوەوە دەبینم ئەم پەرتوکە هەوڵێك بێت، ببیتە نەخشە سازی ژیانت، چونکە کوردستانمان ئێجگار زۆر، هتد......... پێویستی پێتە، دڵنیاشم زۆر زۆر لەوە بەتواناتری بیری لێدەکەیتەوە، کەواتە چاوەڕێی چی دەکەیت؟ فەرموو دەستپێبکە.....

بەخوای دلۆڤانت دەسپێرم، ئەو خـــوایەی بارتەقای هەوڵ و تێکۆشانی مـــرۆڤەکان، بە بەرهـــەمی باش وەڵامیان دەداتەوە لەهەردوو دنیا.

بیرت نەچێت، چاوەڕێی کاری گەورەم لێت.........



چاوێکت لەسەر ڕاگەیاندنمان بێت کە لە خوارەوە لینکەکان دانراون، بۆئەوەی ئاگاداری بەرهەمی نوێ و هەموو ئەو کۆرس و ڕاوێژ و کەوچینگانە بیت، کە لید لە بواری بزنس ودامەزراوەدا پێشکەشی دەکات، بۆئەوەی زووتر بگەیت بە ئازادی و سەربەستی دارایی و ببیتە خاوەن بزنس و دامەزراوەی خۆت بە شێوەیەکی ئەکادیمی و پرۆفیشنالانە.

www.leadku.org

lead_foundation4

lead.foundation

Lead_Foundation

## دەتەوێ لە گرفتی بێکاری رزگارت بێت؟

ئەو چرکە ساتانەی بێکاریت و هەموو دەرگاکان بەڕووتدا داخراون، لە ماڵەوە دانیشتویت و بۆ کڕینی کراسێك داوا لە دایك و باوکت دەکەیت، ئاستی متمانە بەخۆبوونت بە جۆرێك دادەبەزێت، ئەگەر ئەوەندەی سوقرات بزانیت، هەستدەکەیت نەزانیت و کەسێك نیە لەم ئەستێرەیەدا کاری بەتۆ بێت، یان تۆ بۆ هیچ کارێك بشێیت. هەواڵێکی زۆر خۆشم پێیە، ئەوە تەنها وەهمە و لەبێکاریەوە دروست بووە.

هەرکاتێك خۆت دۆزیەوە لە بوارێکدا و کارامەیی و توانا و زانیاریەکانت ڕێکخست، بۆتدەرکەوت کە چ کائینێکی مەزنیت و کاتێکیش بەرهەمت دەبینیت، بە جۆرێك سەرسام و دڵخۆش دەبیت، هەموو ساتێکت لە ساتی پێشخۆی گەورەتر دەبێت، ئەگەر بتوانیت کات بکڕیت، کاتی هەموو خەڵك بۆ خۆت دەکڕیت، ئەو بەرهەمەی دێتە بوون، بەجۆرێك دەبێتە ووزەی ئومێد و ژیان، ئەگەر دنیای خەڵکی شەوەزەنگ بێت، دنیاکەی تۆ چراخانە.



DESIGN
07504808081